پرۆژەی لە سفرەوە
-٤-

# بۆ ئەو گەنجانەی دەچنە زانکۆ

چاپی دووەم



قانع خورشید

قانع خورشيد

# بۆ ئەو
# گەنجانەی دەچنە زانکۆ

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

سوپاس بۆ ئەو خوایەی هێناینیە بوون و عەقڵی پێ داین و فێری کردین.. دورودو سەلام لەسەر پێغەمبەری ئازیزو بنەماڵەو یارو یاوەرە خۆشەویستەکانی.

ئەم نامەیەی نێو پەنجەکانت دەقی موحازەرەیەکە لە سەفەرەیەکدا بۆ قوتابییەکانم، وەك بەرچاوڕوونییەك، وتمەوە، ئەوان هەموویان لە سەروەختی چوون بۆ زانکۆدا نەبوون، بەڵام زۆرێکیان یان تازە چووبوونە زانکۆ، یا پۆلی شەشیان تەواو کردبوو و چاوەڕوانی هاتنەوەی ناویان بوون، یا دەچوونە شەش... ئیتر بە ئەرکی خۆمم زانی ئەوەی بە باشی دەزانم بۆیان، پێیانی بڵێم... مەرج نییە هەرچی پێویستە وتبێتم، هەرچیم وتووە دروست بێت، تەنیا ئەوەندەیە لە نیو سەعات قسەکردندا ئەوەم بە خەیاڵدا هاتبێت پێم وتوون.

دوای ئەوەی چەند جارێك (زانا)ی هاوڕێ و قوتابیم باسی لە گرنگیی موحازەرەکە کردو، جەختی لەسەر

پێویستیی زۆرێک لە گەنجان بۆ ئەم ڕێنماییانە کردەوە، پێم وت: دەی تۆ بینووسەوە با منیش بڵاوی کەمەوە! دوای چەند ڕۆژێك خەبەری پێ دام: کەمێکی ماوە... بە قسەکەی دڵخۆش بووم و، ترسایشم! چون کارێکی تر چووە سەر ئەو دنیا کارە کەڵەکەبەستووەی سەرشانم، کە لەبەر زۆرییان نازانم کامیان تەواو کەم.. بەلام چون ئەمەیان کورت بوو و، ماوەکەیشی دیاریکراوو، کاکە (زانا)یش، خوا چاوی لێ بێت و زاناو کارای کات، جوانی نووسیبووەوەو زۆرێک لە وردە قسەو زیادەکانی لابردبوو؛ زووتر دەستم دایەو، بە یاریی باری تەواوم کرد.. وەك هەمیشە ئەرکی نەخشەسازییەکەشم بە (ئەحمەد) سپارد، خوا بیپارێزێت و لە بەلا بە دووری بگرێت. دەستخۆشی و سوپاسی فرەیشم بۆ ئازیزم کاکە (ڕێناس)ی قوتابیم هەیە، کە لە بەچاپگەیاندنیدا زۆر ماندوو بوو، تەمەن درێژو عاقیبەت خێر بێت یا خوا.

ئومێد ئەکەم هەرکەس دەیخوێنێتەوە، شتێکی لێوە فێر بێت و، کاری پێ بکات و، دوعایەکی خێریش بۆ منی بەندەی ئاتاج و ئەو ئازیزانە بکات کە کاریان لە ئامادەکردنیدا کردووە. ئێوەو باسەکە...

**قانع خورشید _ صمود.**

## لەبەردەم قۆناغێکی تازەدایت...

قۆناغی زانکۆ، پەیمانگا، قۆناغی دوای شەش، هەر بە پێی قۆناغبەندیی خوێندن، دیارە هەنگاوێکی تازەیە، یان قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی مرۆڤدا، بەشێکی گرنگە لە تەمەن.

ئەگەر تەمەن بە خانووەیەکی گەورە بزانین‌و پێنج شەش ژوورێکی تێدا بێت، یەکێك لە ژوورە سەرەکییەکانی ئەو چوار پێنج ساڵەیە کە ئینسان لە زانکۆدا بەسەریدەبات. تۆ کاتێك دەچیتە زانکۆ، لە هەژدە ساڵی تێپەڕیویت، کە ئیتر لە قۆناغی هەرزەکارییەکی ئەوتۆدا نیت، کاڵ‌و کەمئەزموون بیت و، وایشت لێ نەهاتووە پیرو بێتاقەت بیت و لە ژیان بێزار بیت.. لەو نێوانەدایت، کە ناسکترین بەشی تەمەنتە، مرۆڤ لەو قۆناغەدا هەم ئومێدی هەیەو هەم چالاکەو جووڵەی زۆرە، هەم هێزی تێدایە، هەم شتیش وەردەگرێت، هێشتا مێشکی پڕ نەبووە لە زانیاری بەسەرچوو و خراپ، تا میمۆریەکەی پڕببێت‌و، پێویست بێت بۆ وەرگرتنی شتێك شتێکی تر بسڕێتەوە، جێی

هەزاران گێگابایت بە خاڵییەتی لە مێشکیدا ماوە، چون مرۆڤ هەتا پیر بێت، خانەکانی مێشکی پووچ دەبن و بە کەڵکی هیچ نامێنن.

## گرنگترین ئەرك...

لاوی خوێنگەرم! کە چوویتە زانکۆ شتێکی تازە دێتە ژیانتەوە، گرنگترین ئەرکت ئەوەیە نەدیوبدی نەبیتو، لە خۆت نەگۆڕێیت. چونکە ئەگەر مرۆڤ نەشیاوانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەر شتێکدا کرد، دوایی پەشیمان دەبێتەوە.

ئێوەی لاوان سەرەتا کە دەچنە زانکۆ، پێتان دەوترێت قاز! قازی حەقیقی ئەوەیە کە لەو وێستگەیەی تەمەنی پەند وەرناگرێت. کەسی وا هەیە خوێندن تەواو دەکاتو هێشتا هەر قازە، کەسی واش هەیە هێشتا نەچووەتە زانکۆ قۆناغی قازیەتی تێپەڕاندووە، ڕاستتر بڵێم: هەر نەیبینیوەو ناشیبینێت، چون عاقڵەو خۆی فامی هەیەو تێدەگات.

ئەوەی ناشیرینە ئەوەیە: کەسی وا هەیە کە دەچێتە زانکۆ بە جۆرێکی سەیر بیر دەکاتەوە، وەك بڵێیت ئەم یەکەمین و دوایەمین کەسە ئەم شوێنە دەبینێت، نە بەر لەو کەسی تر ئەم شوێنەی بینیوە، نە دوای ئەویش کەس دەیبینێت. لە ماڵ دەڕوات،

مرۆڤێکی فەقیرو بەڕێزو ڕێکوپێکە، لەو سەرەوە دێتەوە بووەتە دەعبایەکی تر، نە سەری.. نە شکڵی.. نە قسەی.. نە زمانی.. نە بیروباوەڕی... هیچی وەکو خۆی نەماوە.

لە ڕاستیدا جێی سەرسوڕمانە، چون بینای زانکۆ هیچی لە بیناکانی قوتابخانە بنەڕەتیو ئامادەییەکان پێشکەوتوتر نییە. هەر شتێکی لەو شێوەیەو بڕێك مامۆستای تازە، کە هەندێکیان زانیاری مامۆستاکانی خوێندنی ناوەندیو ئامادەییشیان پێ نییەو، مەنهەجێکە هەر وەکو مەنهەجی مەکتەب، بەڵکو خراپتریش، چون مەنهەجی قوتابخانە کتێبەو لیژنەیەك خۆیان پێوە ماندوکردووە، لەوێ مامۆستایەکی دەستبەتاڵ دوو سێ قسە دەکاتو، دەڵێت بۆ خۆت بیکە مەلزەمە. بە زۆری وایە، نەك هەمووی. ئیتر نازانم ئەو لە خۆگۆڕانو عەجایەباتو غەرایەباتە چییە مرۆڤێك وای لێ بێت بە شێوەیەکی جیاواز سەیری خۆی بکات.

ئەم لاوە لەخۆگۆڕاوە وەك ئەو فەریکە ڕۆشنبیرانە دێتە بەرچاوم کە دەچن بۆ فەرەنساو ئەڵمانیاو ئەمریکا، کە دێنەوە تف لە خۆیانو بابو باپیریانو ڕابردوو و کەلتورو هەرچی شتی خۆیانە... دەکەن، نازانم چییان لەوێ بینی کە ئەوەندە سەیر بوو، هیچی

وا له نیشتیمانی خۆیان نییه. ئێمه نموونـەی (د.عـەلی شـەریعەتی) و (سـید قوتـب) و کۆمـەڵێك لەوانـەمان هەیـە، کـە دەچـنە دەرەوە؛ دەبنـە دینـدار، فـەرهاد شـاکەلی لێـرەوە دەڕوات بێبـاوەڕە، لـەوێ دەبێتـە سـۆفی! (سـەید قوتـب) کاتێـك لـە میسـرەوە بـۆ گەشـتێکی زانسـتی ڕۆیشـتە ئـەمریکا، دینـدارێکی هاکەزایی بوو و ئینتیمای ئیسلامیی نەبوو، بەڵام کە لە ئـەمریکا دێتـەوە دەچـێتە ڕیزەکـانی (ئیخـوان موسلمین)ەوە.

(د.عەلی شەریعەتی) دەڕوات بۆ فەرەنساو لەگەڵ (سارتەر)و گەورە فەیلەسووفاندا دادەنیشێتو گفتوگۆ دەکـات، کـە دێتـەوە ئێـران دەبێتـە چاکسـازێکی ئیسلامیی، بێزی لە ژیاری ڕۆژئاوایی دێتەوە، بێزی لەو سیستەمە ئیستعماریو ئیستحمارییە دێتەوە، هەروەها لـەم موسـتەعمەرو موسـتەحمەرانەش، کـە بوونەتـە داگیرکراو و داردەستی ڕۆژئاوا.

لە بەرانبـەردا کۆمـەڵێك نـاوبۆش هـەن کـە دەچـنو دێنەوە، بێزیان لە خوا.. پێغەمبـەر، بـەها، ئـەخلاق... دێتەوە.

لە زانکۆش وەکو ئەوانە دەبینن، ئیسلامی دەڕوات، دێتـەوە گاڵتـەی بـە نوێـژ دێـت! خـۆش ئەوەیـە دوای

تەواوکردنی چوار ساڵەکەی زانکۆ، دەگەڕێتەوەو لە مزگەوتدا شانت لێ تون دەکاتو، تەریقیش نابێتەوە!

ڕاستییەکەی من نازانم ئەو کەسانەی زوو زوو بۆچوونەکانیان دەگۆڕنو تف لە دوێنێی خۆیان دەکەن، چینو خۆیان بە چی دەزانن.. بەڵام ئەوەنە دەزانم، هەرچی بن، ژیر نینو لە عاقڵی ئەو کارە ناکەن!

ئەمە مانای ئەوە نییە کە چوویتە زانکۆ، پێشتر چۆن بوویت هەر وا بمێنەوە. بۆ نموونە پێش ئەو قۆناغە زۆرجار لە کۆڵانو گەڕەکدا بە شەرواڵێکی کوردی کۆنەوە گەڕاویت، یان جلێکی ئاساییت لە بەردا بووە، قەت کراست ئوتوو نەکردووە، کە چوویتە زانکۆش، بە بیانووی ئەوەی من لە ژیانمدا هەرگیز قەمیسم ئوتوو نەکردووە، بڵێیت بە خوا عەیبە قەمیس ئوتو بکەم! ئەمە دەبێتە دەردەکەی مەلا نەسرەدین کاتێک وتبووی: پیاو ئەو پیاوەیە لە قسەی خۆی پەشیمان نەبێتەوە، دە ساڵ بەسەر تەمەنیدا ڕۆیشتبوو هەر دەیوت تەمەنم چل و شەش ساڵە! نابێت تۆ بەو شێوەیە بیت، وا بزانیت گۆڕان بەهەر واتایەك عەیبە. گۆڕان ئەگەر بزوتنەوەیەکی سیاسی یان بزوتنەوەیەکی فیکری یان کۆمەلایەتی بێت، ئەگەر

مەرامێکی باشی لە پشتەوە بێت، لە خراپەوە بۆ باش بێت عەیبێکی تێدا نییە.

بۆ نموونە تۆ لە منداڵی تێلێك دەکەیتە سەیارەو لە ناو کۆڵاندا یاری پێ دەکەیت، دوایی کە باڵغ بوویت و یەك دوو خەوی گەنجانەیشت بینی(!)، ئەگەر هەر بڵێیت بە خوا من هەر وەکو جارانم، ژن بێنمو ڕیشیش دەربکەم هەر بە سەیارەی تێل یاری دەکەم! ئەمەیان دەبێتە عەیبو بە دامەزراوی حسێب ناکرێت.

گۆڕانی سروشتی، کە بەسەر مرۆڤدا دێت، نیشانەی ساغبوونی خاوەنەکەیەتی، ئێستا بە هەندێك لە ئێوەی گەنج بڵێ: "ژن بێنە" تەریق دەبنەوە، بەڵام چوار پێنجساڵی تر ئەگەر بە ڕەسمی نەیهێنن شەڕ دەفرۆشن! بەڵام بە گشتی تۆ لە تەمەنی دوازدەو سیازدەو چواردە ساڵی تا شازدە ساڵیش، ئەگەر پێت بوترێت: ژن دەهێنیت؟ دەڵێیت نەوەڵا، دە ساڵی تر.. کەسی وا هەیە دەڵێت: هەرگیز ژن ناهێنم! دوایی کە گەیشتیتە نزیکی بیستو بیستویەكو دوو ساڵی، ئیتر مۆزە مۆزە دەست پێ دەکاتو... حاڵەتێکی سروشتیشەو دەبێت بیهێنیتو منداڵتان ببێت. ئەمانە سوننەتی ژیانن.

لەبەر ئەوە تێبگەن لە نێوان ئەو شێتبوونو لەخۆگۆڕانەو ئەو چەقبەستوویيو جێمانەدا سنوورێکی

ناوەند هەیە، پاراستنی ئەو سنوورە پێویستە، مرۆڤی عاقڵ زۆر پێویستی بە درێژکردنەوەی ئەم مەسەلە نییە، ئەمە مەسەلەیەکە لەوانەی گرنگە بیزانن.

**قۆناغی زانکۆ بەپیتترین قۆناغی تەمەنە، لە دەستی مەدە!**

ئـەی گـەنجی ئـازیز! یـەکێکی تـر لـەو خاڵانـەی پێویستە بیزانیت، گرنگیی ئەم ساڵانی تەمەنەیە کە لە پێشـتدایە. قۆسـتنەوەی ئـەم قۆناغـەی تەمـەنت بـۆ فێربوون، خوێنـدن، خوێندنـەوە، پەیـداکردنی هـاوەڵی باش، هەموو ئەمانە دەچنە یـەك خانـەوە: (ڕنینـەوەی فـەڕو پیتـی ئـەو بەشـەی تەمـەن). ئـەو قۆناغـەی تەمـەنت، ئـەو چـوار تـا شـەش سـاڵەی تەمـەنت، بـە شێوەیەك بقۆزەوە، سوودێکی وای لێ ببینیت، دوایـی، لە هەموو ژیانتدا شوێنەواری دیار بێت.

مرۆڤ بە سروشت زوو زوو دەگەڕێتەوە بۆ ڕابوردوو، سـۆز بـۆ ڕابـوردوو _نۆسـتالژیا_ هـەوێنی ژیـانی زۆربەمانـە، زۆرێـك لـە ئێمـە ئەوەنـدەی بـە خـەیاڵی گوزەشتەمانەوە دەژین، ئەوەندە ئومێدی داهـاتوو بـۆ درێژەدان بە ژیان پاڵمان نانێت.. دەی ئـازیزم! کارێـك مەکـە کاتێـك _لـە دوای زانکـۆ_ ئـاوڕ بـۆ دەمـەکانی زانکـۆت دەدەیتـەوە، تـەریق بیتـەوەو هەسـت بـە شەرمەزاری بکەیت، وا ڕەوتار کە، سبەی، وەختێك بـە خەیاڵ بۆ ئـەم ڕۆژانـەت دێیتـەوە، هێنـدە گوڵـت تێدا

چاندبێت؛ ئافەرین لە خۆت بکەیت، کەیفت بە خۆت بێت‌و خۆزگە بەو ڕۆژانە بخوازیت..

کە دڵنیای سبەی _ هەردی گوتەنی_ "بە سەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی پیریت دەوەستیت‌و، شریتی عومری ڕابوردووت وەکو خەو دێتە بەر چاوت"، هەوڵدە شریتەکەت سەراپا سەرگوزشتەی نائومێدیت نەبێت، بەڵکو ئەم ڕۆژانەی زانکۆت بکە کوانووی گەرمکردنەوەی شەوو ڕۆژە ساردەکانی ئایندەت... هەمیشە بیر لە داواکەی پیرە عارفی شیرین گوفتار (مەحوی)ی ڕەحمەتی بکەرەوەو کاری پێ بکە، کە دەڵێت:

برا ! فکری چرا، کبریتی فرسەت تا لە دەستایە

شەوی یەڵدا لە پێشە، ڕۆژی عومرت وەختە ئاوا بێ

نەبادا بەیانی ﴿یا لَیْتَنِي قَدَّمتُ لِحَیاتِي﴾ ویردی سەر زارت بێت، ئای چەند ناخۆشە ڕووت نەیەت بۆ قوتابییەکانت، بۆ منداڵەکانت باسی ڕۆژانی ڕابوردووی ژیانت بگێڕیتەوە! چما کەسێك لە جەنگدا هیچ سەروەرییەکی تۆمار نەکردبێت، دەتوانێت لە کاتی سەروەری وڵاتەکەیدا باس لە ئازایەتییەکانی بکات؟ زۆرن ئەوانەی ناوێرن بۆ ساتێکیش ڕوو بۆ لای ڕۆژە تێپەڕیوەکانی ژیانیان وەرگێڕن. نەکەیت تۆ لەوانە بیت.

## هاوڕێکەت ئاوێنەتە، هەوڵدە ئاوێنەیەکی بێ گەرد بۆ خۆت هەلبژێریت

لاوی شیرین! هاوڕێی باش یەکێکە لە گرنگترین شتەکان. لە بەشی ناوخۆییدا، لە ناو شاردا، پەیداکردنی هاوڕێ شتێکی پێویستە، ئاسانیش نییە، سروشتی خۆیشت ڕۆڵی هەیە، کەسی وا هەیە پێنج خولەك لە شوێنێکدا لێی گەڕێ هاوڕێی خۆی دەدۆزێتەوە، کەسی واش هەیە بە ساڵ تاقەتی نییە هاوڕێیەك پەیدا بکات.

گەنجی ژیر! دەبێت بۆ کرانەوە بە ڕووی دەوروبەرتدا زۆر لە خۆت بکەیت، با سروشتیشت لەو سروشتانە بێت کە لەگەڵ خەڵکیدا ناکرێنەوە. لە قۆناغی زانکۆدا ئەو تەبیعەتەت بشکێنە، مەرج نییە بڵێی بە خوا ئێمە هەر بە بنەماڵە واین، هاوڕێمان کەمە، ئەمە قسەیەکی بێ مانایە. تۆ دەتوانیت لە دەوروبەرت جیاواز بیت، وەکو ئەوەی زۆربەتان پێ دەچێت لە بیرکردنەوەدا لە دایكو باوکتان جیاواز بن.

گرنگە پاراستنی ئەو سنورانە بزانیت، چی هاوڕێیەك باشە؟ خۆت دەزانیت، مەعقول نییە من بۆت بنووسم هاوڕێیەك بەم جۆرە بێت؛ باشە! بەلام بزانن،

پەندێك هەیە دەڵێت: "دۆستم ئەوەیە دەمگرییێنێت، دوژمنیشم ئەوەیە دەمکەنێنێت"، ئەم پەندە بکەن بە پێوەری باش‌و خراپیی هاوڕێ، چون ئێستا زۆر کەسی وا هەیە تۆ وەکو ئامرازی خۆشیی خۆی سەیر دەکات، وەك تام‌و چێژێك بۆ خۆی بەکارتدێنێت.. بۆ پێکەنینی خۆی.. بۆ کات بردنە سەری خۆی.. ژیانی لەگەڵ تۆدا دەباتە سەرو دوایش ئیشی پێت نەما، بە ساڵیش بیری ناکەویتەوە... وەك چۆن کەسێك گلاسێکی سەفەری دەکرێت‌و پارێزگای لێ دەکات‌و بەکاری دەهێنێت، دوایش پێیەکی پێدا دەنێت‌و پانی دەکاتەوە.. ئەو لە خۆشەویستی گلاسەکە نەبوو، کە دەیپاراست، بەڵکو بۆ ئاوو چا خواردنەوەی خۆی بوو!

کەسی وا هەیە ئاواهی بە کارت دەهێنێت. بۆ نموونە جاری وا هەیە تۆ کەسێتییەکی دیارت هەیە، خۆشەویست‌و بەرێزیت، ئەمیش بۆ ئەوەی خەڵکی سەلامی لێ بکەن‌و ڕێزی بگرن‌و، ئیشی بۆ جێبەجێ بکەن، هاوڕێتیت دەکات. هەرکاتێك ئەو ئیشەی پێت نەما؛ فرێت دەداتە کەنارەوە. بەڵام هاوڕێی وا هەیە حەز دەکات لە کاتێکدا لەگەڵتدا بێت کە کێشەت هەیەو پێویستت پێیەتی. وا دەزانم هەموو مرۆڤێك عەقڵی بێت‌و خۆی گێل نەکات، بۆ هاوڕێی دووەم دەگەڕێت‌و تا نەیدۆزێتەوە واز ناهێنێت!

## گێل مەبە!

یەکێکی تر لەو خاڵانەی گرنگە بیزانیت ئەوەیە: لە زانکۆدا هەرچی دەبیت، نەبیتە ڕەمزی گێلی، چون بە داخەوە لە چەندین پۆلی قوتابخانەکانو، گروپی نێو کۆلیژو زانکۆکانو، ژووری بەشەناوخۆییەکانو، لە گەڕەكو، تەنانەت لە مزگەوتیش... هەندێك خەڵکی دیندار، بە تایبەتی ئەوانەی پێیان دەڵێن (ئیسلامیی)و، پەنجەیان بۆ درێژ دەکرێت، بوونەتە گاڵتەی دەمی دەوروبەر، گێلۆکەن، بۆ چواردەوریان بوونەتە مەسخەرە، پێیانەوە ڕادەبوێرن! من، لە منداڵییەوە تا ئێستا، نە لە نێو ئیسلامیو نە لە عەلمانی، حەزم لە کەسی لات و گێلۆکە نەبووە.

بۆچی مرۆڤ گێل بێت؟ بە جۆرێك بە هەمیشە قەرزت بە لای خەڵکەوە بێت. هەمیشە قسە بە دەم بە، ئامادەی وەڵام بە، دەم مردوو مەبە.

دەگێڕنەوە جارێکیان (شێخ جەمالەددینی ئەفغانی) دەچێتە فەڕەنسا، لە چێشتخانەیەکی پاریسدا بە دەست نان دەخوات، بە عەمامەو سەرو شکڵێکی زلو جلو بەرگێکی ناسروشتییەوە. زۆربەی ئەو کەسانەی لە چێشتخانەکەدان دێنە سەیرکردنی!

دەڵێن: ئەمە کێیە؟! لە کوێوە هاتووە؟! خاوەنی چێشتخانەکە پێی دەڵێت:

– ئەوە پیسە، بۆ بە دەست نان دەخۆیت؟!

شێخیش دەڵێت:

- ئەو کەوچکەیە، لە بەیانییەوە تا ئێستا، چەند کەس نانی پێ خواردووە؟
- نازانم، لەوانەیە چوار.. پێنج کەس نانی پێ خواردبێت، بەڵام ئێمە دەیشۆرین و خاوێنی دەکەینەوە.
- من ئەم کەوچکەیەم تەنیا هی خۆمە، ڕۆژانەیش بە لای کەمەوە، لە کاتی دەست نوێژگرتندا، پێنج جار دەیشۆرم.

پاشان شێخ جمال الدین دەستی بەرز دەکاتەوەو دەڵێت: کەس نانی پێ خواردووە؟ دواتر دەڵێت: کەواتە من لە ئێوە پاکترم!

لێرەدا ئەم پیاوە خۆ دەیتوانی بە کەوچک نان بخوات[1]، بەڵام حەز دەکات دیوێکی تر پیشان بداتو

---

[1] ئەفغانی کەسێکی زۆر کراوەو تێگەیشتوو بووە، بە کەوچک نانخواردنی پێ ئاسایی بووە، لەو دۆگمایانە نەبووە وا کەوچکیان پێ حەرامەو، کتێبی لەبارەوە دەنووسن: (الصواعق فی تحریم الملاعق)!!
لێرەدا تەنیا ویستوویەتی ئەو پەیامە بە فەرەنسییەکان بگەیەنێت: مەرج نییە هەموو شتێکی ئێوە نیشانەی مەدەنییەتو پاکیتان بێتو هی ئێمە پێچەوانە.

بلێت که ئێوه هەرچیتان هەیە شانازی پێوه مەکەن.

هەروەها جارێکیان قوتابییەکی موسڵمان لە زانکۆیەکی ئەمریکی دەبێت، لە ناو زانکۆکەدا حەوزی زەوییان هەیە، ئەویش لە ناو حەوزەکەدا پێی دەشوات! مامۆستایەك دێتو هاواری لێ دەکاتو دەڵێت:

- تۆ ڕۆژهەڵاتیتو موسڵمانی، هەروا نەفام و دەشتەکین، پێت مەخەرە ناو حەوزەکە.

ئەویش دەڵێت:

- مامۆستا! جەنابت ڕۆژی چەند جار دەموچاوت دەشۆریت؟
- بەیانیان لە خەو هەستم، دەموچاوم دەشۆرم.
- تۆ ڕۆژی یەکجار دەموچاوت دەشۆریت، بەڵام من ڕۆژی پێنج جار پێم دەشۆرم، کەواتە پێی من لە دەموچاوی تۆ پاکترە!

لەم کاتەدا خوێندکارەکانی دەوریان دەست دەکەن بە پێکەنین.

هیچ نەبێت توانی لەوێدا تەریقی بکاتەوە. ئەگەر هاتو تۆ بتوانیت لە مەجلیسدا تۆپ لە بەرانبەرەکەت بسێنیت، کارێکی گرنگت کردووە. لەو جۆرە شوێنانەدا "قال رسول الله" و "قال تعالى" وەختی نییە، ئەو قسانە بۆ کەسێك دەوترێت خاوەنی دڵ بێت

-ئـەهلی دڵ بێـت- وەك لـە سـوورەتی (ق)دا خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق:٣٧). واتە: "ئامۆژگاری بۆ كەسێكە دڵی هەبێت، یان بە باشی گوێ ڕاگرێـتو ئامـادە بێـت دڵو گـــوێی بـــداتێ". كەســـی دڵـــڕەق دەبێـــت بیشكێنیتەوەو بە قسـەی حـەقو ڕوون لـە نـاو دەمـی دەیت، كورد گوتەنی "جێی مشت پێلەقەیە"... بـەڵام نەشگاتە شەڕفرۆشتن.

جـاری وا هەیـــە كەســـێكی عـــەلمانی دەیـــەوێت ڕابوێرێـتو سـوكایەتیت پـێ بكـات، گـورج بەرپەرچـی بدەرەوە.. مـن جارێكیـان قوتـابی بـووم، لـە پێنجـی ئامادەیی، لە ناو خوێندنگەدا سیمینارێكیان ڕێكخست. یەكێك لە نوێنـەری ڕێكخراوەكـانی سـەر بـە دەسـەڵات وتی: بە ڕاستی یـەكگرتووەكان تـا ئێسـتا تەقەیـەكیان بۆ كورد نەكردووە، نازانم بە چییەوە شانازی دەكـەن؟ منـــیش پـــێم وت: یـــەكگرتوو تەقەیـــەكی بـــۆ كـــورد نەكردووە، تەقەیەكیشی لە كورد نەكردووە... ئێوە لە شـــەڕی براكوژیـــدا بـــاوك، بـــرا، كـــوڕ...ی كوردتـــان دەكوشـت، یـەكگرتووش موچـەی بـە پاشماوەكانیـان دەدا.. بەمـەوە شـانازی دەكـەین! ئـیتر لەوێـدا كـابرا وەخت بوو ببێت بە ئاو! تۆ نابێت باسی ئـەوە بكـەیت تەقە جۆری هەیە، چی باشەو چی خراپو، خـۆ مـەرج

نییـــه هـــەموو تەقـــەکردنێك بـــاش بێـــت، ئێمـــه ئاشتیخوازین... وەختی ئەو جۆرە قسانە نییە دەبێت بیتەزێنیت، خۆی بیری بکەوێتەوە بەهای چەندە.

دوا ئامۆژگـاریم ئەوەیـە: کاتێـك دەچـنە زانکـۆ بخـوێنن، هیممەتبـەرز بـن، چـون موسـڵمان هیممەتبەرزە. هەمیشە داوای چڵەپۆپە بکەن، "ئەگـەر داواتان لە خودا کرد، داوای فیردەوس بکەن"[٢]، مەڵێن: بە خوا لە بەر دەرگای بەهشتیشدا فرێمان بدەن، هـەر باشە، خوا نەیبڕێ بەسمانە! بەڵکو بڵێ خوایە بمخەرە خۆشـترین شـوێن، مـوڵکی خـوا هێنـدە زۆرو فراوانـە، بەشـی هـەموو داوایـەك دەکـات، ئەگـەر بـە خۆیشـتدا دەبینیـت بجوڵێیـت، ئـیتر لـە چـی دەترسـیت؟ بـۆ ناپاڕێیتـەوە: خوایـە! ئەگـەر دە حـۆری بـە خـەڵکی دەدەیت، سەد بدە بە من!

بەڵام ئەمە بە لافو گـەزاف نابێـت، دروسـت نییـە مننەت بە سەر خوادا بکەیت، بڵێی بە خوا نەمداتێ من قبوڵ ناکەم، ئەمە بێ ئەدەبییە، بەڵکو کوفرە. بجوڵـێ و هیوات گەورە بێت.

تـەماحت لـە هـەموو شـتێکدا هـەبێت، لـە هـیچ نارەحەتییەکی ژیان مەترسە، لە بەرزایی سامت نـەبێت،

---

[٢] حديث: "فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ". أخرجه أحمد: (٨٤٠٢). والبخاري: (٢٧٩٠).

مانــەوەی نێـو تــاریکی ئازارەکــەی لــە مانــدووبوونی گەیشتن بە ڕووناکی سەختترە، ئەگەر لە بەرزبوونەوە سڵ بکەیت، دەبێت تا ماوی لـە پەستییدا بمێنیتـەوە.

وەکو شاعیری تونسی (أبو القاسم الشابی) دەڵێت:

وَمَنْ يَتَهَيَّبْ صُعُودَ الجِبالِ

يَعِشْ أَبَدَ الدَّهرِ بَينَ الحفَرِ

واتە:

کەسێك نەوێرێ بە کێودا هەڵگژێ

دەبێ تا هەتایە لە نێو دۆڵدا بژێ

دەبێت هەمیشە متمانەت بە خـۆت هـەبێت، بڵێیـت من ئەو ئیشە دەکەم.. ئەم قۆناغە دەبڕم.. ئەو کتێبـە تەواو دەکـەم.. کەسـی وا هەیـە دەڵێـت: "مـن نـاتوانم وەکو فلان زیرەك بم، چون مێشکی ئەو باشـترە"! بـۆ مێشـکی لـە تـۆ باشـترە؟ خانـەی مێشـکی هـەر وەکـو تۆیـەو، وەکـو تـۆیش نـان دەخـوات! گـەر دەتـەوێت سەربەرزو ڕووسوور بیت، خۆتت لـە کـەس پـێ کـەمتر نەبێت.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه.

بە هەولّی هاوڕێی زێدە شیرینم (زانا موحسین لاهووری) لە ٢٠١١/١١/١٩ نوسراوەتەوە.

لە نیوەشەوی ٢١ی محەڕەمی١٤٣٣ بەرانبەر ١٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١١ ڕێکخراوەو بۆ چاپ ئامادە کراوە.

